## ئوسوڵی ئەشعەرییەکان

١- سەرچاوەی وەرگرتنی عەقیدە لەلای ساداتی ئەشاعیرە قورئانی پیرۆز و سوننەتی موتەواتیر (یەک بەدوای یەک) لەگەڵ بەڵگە وە دەلیلە ئەقڵییەکان بڕەڕو یەکلای کراوەکانە.

٢- بەڵگە یەکلا کراوەکان یەکانگیرن نەک دژبەیەك.

٣- فەرمایشتە ئاحادەکان (تاکەکان)، بەڵگەی سەربەخۆ نین لە بنامە عەقائیدییەکان

٤- ڕوکەشی لەفزی دەقەکان کە پێچەوانەی موحکەم و بەڵگە بڕەڕو یەکلایی کەرەوە عەقڵیەکان بن وەناگیرێ دەبێ تەئویل ئەکرێت.

٥- خوای باڵادەست وەسف ناکرێ بە شتێ کە بەش بەشە.

٦- ئیمان بەڕاستیزانینی دڵە لەگەڵ ملکەچی و پەسەنکردندا، کردەوەی چاکیش بەرهەمی ئیمانە.

٧- قورئان فەرمایشتی پەروەردگارە، کە گفتۆگۆیەکی نەفسییە وەستاوە بەذاتی پەروەردگار، قەدیم و هەرهەبووە و دروستکراو و نویێ نیە.

٨- خواردن خۆی تێرت ناکات، ئاگریش خۆی ناتسوتێنی، دەرمانیش خۆی شیفات پێ نابەخشێ، خودای باڵادەست تێربوون و شیفا و سوتان دروست دەکات (لەساتی ئەم هۆکارانەدا)

٩- تەکلیف و پاداشت و سزا وابەستەیە بە فەرمانی خودایی و نێردراوی پەیامبەران، نەک بە چاکە و خراپەی شت.

١٠- هەندێ لە دەقەکان، بەگوێرەی مانای موفرەدات فەهم ناکرێت، بەڵکو بەگوێرەی سیاق و مانای لێکدراوی لێی تێدەگەین، مانا وەرگیرەوەکانی موفرەداتی جیا جیا لە سیاقدا تەئویل ئەکرێ گەر بەڵگەیەک هەبێ لەسەر ئەوەی مانای مەبەست نیە.

١١- هەر شتێ دەقی قورئان و نەبەوی ئامەژەی پێ بکرێت پێویستی ئیمانی پێ بهێنرێت، ئیلا مەگەر پێچەوانە بێت لەگەڵ حوکمێکی قەطعی و براوە لە شەرع و ئەقڵدا. ئەمەش بەواتای ئەوەی پێویستە ئەو دەقە تەئویل بکرێت، یاخود تانە لە جێگربوونی بدرێت گەر فەرمایشتی (ئاحاد) بوو.

١٢- کوفر پێچەوانەی ئیمانە، چونکە دەگەڕێتەوە بۆ بەدرۆخستنی هەموو فەرمانێکی خودا و پێغەمبەر ﷺ کە جێگیربووە لەڕووی قەطعیەوە.

١٣- هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ ڕەزای خوایان بۆ بەکار ئەبردرێ بە خراپە باس ناکرێت.

١٤- خەلیفە و جێنشینەکانی پێغەمبەر ﷺ ئیمامی ئەبوبەکرە، ئینجا ئیمامی عومەر، ئینجا ئیمامی عوسمانە، پاشان ئیمامی عەلی، ڕەزای خوایان لێبێت، پێشەوا و خەلیفەش لە قورەیشە.

١٥- پێویستە خوای گەورەی باڵادەست پاکڕابگێری لە سیفاتی دروستکراوەکان وەکو شوێن و لا و جوڵە و گواستنراوە و دابەزین و بەرزبونەوە هەست پێکراوەکان.

١٦- خوای گەورە تاکە هەر لە ئەزەلەوە واتە: خودا هەبووە هیچ شتێ نەبوو جگە لەو نەبێ، وە هیچ شتێکیش نەبووە لەپێش ئەو وە لەگەڵ ئەویش وە عەرش و غەیری ئەویش جگە لە خودا هەموویان پەیدابوو و دروستکراون.

١٧- ئەوە دەچسپێنن کەخودا بۆخۆی چەسپاندوویەتی، لەهەمان کاتدا ئەوەش ڕەت دەکەینەوە کە ذاتی خوا بە سیفاتی دروستراوەکان بچوێندرێ، بۆیە سیفەتی (الاستواء) دەچەسپێنین وەدەڵێن: جێگربوون و پێوە نوسان نیە.

١٨- خوای گەورە پاک ڕادەگرێن لەوەی کەوا گۆڕان و تەبدیلی بەدوادا بێت.

١٩- قورئان، خودای گەورە کە دایبەزاندووە بەزمانی عەرەبی، بەپێی ڕێگایەکانی ئەوان بۆ بەکارهێنانی لەفز و لێکدراوەکان، بۆیە دەقی قورئان فەهم ناکرێت (بەهەمان شێوە دەقەکانی سوننەتیش) ئیلا مەگەر بەپێی ئوسلوب و ڕێگایەکانی ئەوان نەبێت.

«ئەو مەقالەیە لەلایان شێخ صلاح الدین کوڕی ئەحمەدی ئیدلیبیەوە نوسراوە»

**ولحمد لله ربّ العالمين**